٥٥ فائدة في
آداب العيد وأحكامه

Ba_Kurty

# ٥٥ خاڵی گرنگ سەبارەت بە
# ئادابەکانی جەژن
# و حوکمەکانی



تۆڕی زانستی بەهەشت
www.ba8.org

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله.

**خوشک و برای موسڵمان** : ئەم نامیلکەی بەردەستت بریتی یە لە (٥٥) خاڵی گرنگ و کورت سەبارەت **ئادابەکانی جەژن و حوکمەکانی** داوا دەکەین لە خوای گەورە بیکاتە مایەی سوود پێگەیاندن، وە پاداشتی خێری ئەو بەڕێزانەش بداتەوە کە هاوکار دەبن لە بڵاوکردنەوە و چاپکردنی .

١ - جەژن یەکێکە لە دروشمەکانی ئیسلام.

٢- بۆیە پێی وتراوە (عید) لەبەر ئەوەی ساڵانە دەگەڕێتەوە و دوبارە دەبێتەوە، وە لەبەر ئەوەی هەموو ساڵێك دەگەڕێتەوە بە خۆشییەکی تازەوە.

٣- جەژن دروشمێکە لەناو هەموو میللەتێك هەیە، و خۆشی خۆیانی تیا دەردەبڕن.

٤- جەژنی ئێمە زیکر و یادی خوای گەورەیە، وە جەژنی جگە لە ئێمە بریتی یە لە شیرك و هاوەڵبڕیاردان بۆ خوای گەورە.

٥- جەژنەکان تەوقیفین، بۆ موسڵمان نییە جگە لەو سێ جەژنە خۆشی تیا دەرببڕێت.

- جەژنێك کە هەموو هەفتەیەك دوبارە دەبێتەوە ئەویش جومعەیە.

- دوو جەژنیش کە ساڵانە دوبارە دەبێتەوە ئەویش جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربانە.

٦- جەژنی موسڵمانان لەو دروشمانەیە خوای گەورە دایناوە پێویستە زیندوو بکرێتەوە و بەڕێوە بچێت. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: « إِنَّ لِكُلِّ قَوْمٍ عِيدًا، وَهَذَا عِيدُنَا». [(١)] واتە: «هەموو گەلێك جەژنی خۆی هەیە ئێمەش ئەمە جەژنمانە».

[(١)] رواه البخاري (٩٥٢)، ومسلم (٨٩٢).

٧- جەژنی موسڵمان نزیك بوونەوەیە لە خوای گەورە، کە بە گەورە دانانی خوای گەورەی تێدایە و دڵخۆشی موسڵمانانی تیایە لەسەر ئەو نازو نیعمەتانەی خوای گەورە، پەیوەستە بەو عیبادەتە گەورانەوە ئەویش لەپاش ئەو دوو عیبادەتە کە ڕۆژوو گرتن و حەج کردنە.

٨- جەژنی ڕەمەزان لە دوای ئەو عیبادەتە دێت کە بەڕۆژووبوونە، وە جەژنی قوربانیش لەدوای دروشمی حەج دێت، وە ڕۆژێك پێش ئەوە عەرەفەیە کە باشترین ڕۆژە.

٩- لە گەورەترین کارەکانی ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان دەرکردنی زەکاتی سەرفیترەیە لە پێش نوێژی جەژن، کە پاکبوونەوەیە بۆ ڕۆژووان و خواردنێکیشە بۆ فەقیر و هەژارەکان.

١٠- بەهیچ شێوەیەك دروست نییە ڕۆژووگرتن لە ڕۆژی جەژن، ئەبی سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێبێت) فەرموویەتی: "أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ صِيَامِ يَوْمَيْنِ يَومِ الْأَضْحَى، وَيَوْمِ الْفِطْرِ" (١) واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لە ڕۆژووگرتنی دوو ڕۆژ، یەکەم ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان، وە یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان.

(١) رواه البخاري (١٩٩١)، ومسلم (٨٢٧).

١١- لە سوننەتەکانی ڕۆژی جەژن الله أكبر کردنە، وە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلِتُكَبِّرُوا اللَّهَ عَلَى مَا هَدَاكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ [البقرة: ١٨٥].

واتە: وە بۆ ئەوەی کە الله أكبر بکەن و خوای گەورە بە گەورە بزانن، وە کە ڕۆژوو تەواو ئەبێت و ئێوە ئەچن بۆ جەژن الله أكبر بکەن لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە هیدایەتی داون، وە بەڵکو شوکرانەبژێری خوای گەورە بکەن.

١٢- دروستە وتنی الله أكبر لە جەژنی ڕەمەزان لە خۆر ئاوابوونی کۆتا ڕۆژی ڕەمەزان تا ئەو کاتەی ئیمام دێت بۆ نوێژی جەژن.

١٣- وتنی الله أكبر لە جەژنی قوربان لە هەموو کاتەکان دەکرێت تا چوارەم ڕۆژی جەژن.

١٤- ئەو الله أكبر کردنانەی لە پێشینە چاکەکانەوە هاتووە:

"اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، وَللهِ الْحَمْدُ"

"اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ وَللهِ الْحَمْدُ"

اللَّهُ أَكْبَرُ كَبِيراً اللَّهُ أَكْبَرُ كَبِيراً ، اللَّهُ أَكْبَرُ وَأَجَلُّ ، اللَّهُ أَكْبَرُ وَلِلَّهِ الْحَمْدُ.

وە هەندێکیان ئەم زیادەیەیان فەرمووە: **"اللَّهُ أَكْبَرُ عَلَى مَا هَدانَا"**

١٥- کارێکی باشە بە دەنگی بەرزەوە الله أکبر بکرێت، چونکە دەرخستنی دروشمی ئاینی ئیسلامە.

١٦- نابێت و ڕێگە پێدراو نییە، کە الله أکبر بە کۆمەڵ بکرێت و بە یەك دەنگەوە، یان هەندێکیان بیڵێن و دواتر ئەوانی تر بەدوایاندا بیڵێن.

١٧- پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەژندا جلی جوانی لەبەر دەکرد سەر و ڕیشی چەور دەکرد و بۆنی خۆشی لە خۆی دەدا و پۆشاکی تازەی لەبەر دەکرد.

١٨- پێویستە لەسەر ئافرەت لەکاتی دەرچوونی بۆ نوێژی جەژن پۆشاکی شەرعی لەبەردابێت، وە دوور بکەوێتەوە لە پۆشاکی ناشەرعی و ڕازاوە.

١٩- لە ئادابەکانی جەژن ئەوەیە جەژنە پیرۆزە بکرێت بەو وتە جوانانەی لەناو خۆیاندا باوە و پێچەوانەی شەرع نییە، وەکو: (تقبل الله منا ومنكم - خوای گەورە لە ئێمە و ئێوەشی وەربگرێت) وە (جەژنتان پیرۆزبێت).

٢٠- نوێژی جەژن لە دروشمە گەورەکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلامە، وە لە وتەی تەواو ئەوەیە واجبە لەسەر پیاوان، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردووە و خۆیشی بەردەوام بووە لەسەری.

٢١- نوێژی جەژن لە دوای دەرچوونی خۆر بە ئەندازەی ڕمێك (نزیکەی ١٥ دەقە دەكات)، وە دروستە نوێژی جەژنی ڕەمەزان دوابخرێت و نوێژی جەژنی قوربان زوو بکرێت وەك شوێنکەوتنێك بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ.

٢٢- سوننەتە غوسڵ دەرکردن بۆ نوێژی جەژن.

٢٣- سوننەتە پێش دەرچوون لە ماڵ بۆ نوێژی **جەژنی ڕەمەزان** چەند دەنکە خورمایەک بە شێوەی تاک بخۆی ، ئەم سوننەتە زۆرێک نایزانن یان پشتگوێ خراوە و لە بیرکراوە.

٢٤- بەڵام بۆ نوێژی جەژنی قوربان سوننەتە هیچ نەخورێت تا لە قوربانییەکەی دەخوات.

٢٥- سوننەتە زوو دەرچوون بۆ نوێژی جەژن و نزيك بوون لە ئیمامەوە.

٢٦- سوننەتە لەکاتی چوون بۆ نوێژی جەژن تەکبیرە بکرێت بە دەم ڕێگاوە، **"كَانَ يَخْرُجُ يَوْمَ الْفِطْرِ فَيُكَبِّرُ حَتَّى يَأْتِيَ الْمُصَلَّى ، وَحَتَّى يَقْضِيَ الصَّلاَةَ ، فَإِذَا قَضَى الصَّلاَةَ قَطَعَ التَّكْبِيرَ".** [1]واتە: "پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك دەچوو بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزان تەکبیرەی دەکرد" تا دەگەیشتە شوێنی نوێژەکە، نوێژەکەی تەواو دەکرد ئیتر تەکبیرەی ناکرد.

---

[1] روي مرفوعا وموقوفا، وصححه مرفوعا وموقوفا الألباني في الإرواء (٦٥٠).

٢٧- دەرچوون بۆ نوێژی جەژن بە پیادە و لەسەرخۆیی و هێواشی.

ئیبنو عومەر (ڕەزای خوایان لێبێت) فەرموویەتی:

"كَانَ يَخْرُجُ إِلَى الْعِيدِ مَاشِيًا وَيَرْجِعُ مَاشِيًا". [1]

واتە: "پێغەمبەری خوا ﷺ دەچوو بۆ نوێژی جەژن بە پیادە وە بە پیادەش دەگەڕایەوە".

٢٨- سوننەتە دەرچوون بۆ نوێژی جەژن لە ڕێگایەکەوە ، وە گەڕانەوەش لە ڕێگایەکی ترەوە بێت، پێغەمبەری خوا ﷺ وایکردووە.

---

[1] رواه ابن ماجه (١٢٩٤)، وحسنه الألباني.

٢٩- لە سوننەتەکانی نوێژی جەژن ئەوەیە لە دەرەوەی مزگەوت بکرێت ئەگەر کرا و گونجا.

زانایان نوێژی جەژن لە مەککە جیا دەکەنەوە لە موصەللا ناکرێت، بەڵکو هەر لە مەککە دەکرێت.

٣٠- نوێژی جەژن لە شار و لادێ دەکرێت، وە لە چۆڵەوانی و سەفەر ناکرێت.

٣١- منداڵ و ئافرەتان و ئەو ئافرەتانەی لە سوڕی مانگانە و زەیستانین دەردەچن بۆ نوێژی جەژن، تا بەشداری ئەو خێرە بکەن لە دوعای موسڵمانان بێبەش نەبن.

ئوم عەطیە (ڕەزای خوای لێبێت) فەرموویەتی:

**"أُمِرْنَا أَنْ نُخْرِجَ الحُيَّضَ يَوْمَ العِيدَيْنِ، وَذَوَاتِ الخُدُورِ فَيَشْهَدْنَ جَمَاعَةَ المُسْلِمِينَ، وَدَعْوَتَهُمْ وَيَعْتَزِلُ الحُيَّضُ عَنْ مُصَلَّاهُنَّ".** [١]

واتە: ئێمە فەرمانمان پێدەکرا دەربچین بۆ نوێژی جەژن، ئەو ئافرەتانەی لە سوڕی مانگانەن و تازە پێگەیشتوون و باڵغ نەبوونە، تا بەشداری ئەو خێرە بکەن و دوعا بۆ موسڵمانان بکەن، بەڵام ئەو ئافرەتانەی لە سوڕی مانگانە بوون نەدەهاتنە ناو شوێنی نوێژەکەوە".

[١] روا البخاري (٣٣٨)، ومسلم (١٤٧٥).

٣٢- نوێژی جەژن دوو ڕکاتە و ئیمام دەنگ بەرز دەکاتەوە تیایدا ، و بەم شێوەیە ئەنجام دەدرێت :

دوای (الله أكبر)ە نوێژ دابەستن و پێش خوێندنی سورەتی فاتحیە حەوت (الله أكبر) دەکرێت پاشان سوڕەتی فاتیحە دەخوێنرێت پاشان سورەتێکی تر دەخوێنرێت.

لە ڕکاتی دووەم لە پاش (الله أكبر)ی هەستانەوە و پێش خوێندنی سورەتی فاتحیە پێنج (الله أكبر) دەکرێت پاشان سوڕەتی فاتیحە دەخوێنرێت پاشان سورەتێکی تر دەخوێنرێت.

ئیمام لە (الله أكبر)ە کاندا دەنگ بەرز دەکاتەوە

٣٣- لە پێغەمبەری خواوە ﷺ هیچ نەهاتووە کە لەنێوان (الله أكبر)ەکان هیچ زیکرێکی کردبێ ، بەڵام لە ئیبنو مەسعودەوە هاتووە (ڕەزای خوای لێبێت) لە بەینی هەموو (الله أكبر)ەکان (سبحان الله) و (الحمد لله) و تەسبیحاتی کردوە.

٣٤- پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕکاتی یەکەم سورەتی "سبح اسم ربك الأعلى"ی دەخوێند، وە ڕکاتی دووەم لە دوای سورەتی فاتیحە "هل أتاك حديث الغاشية"ی دەخوێند. [1]

[1] رواه مسلم (٨٧٨).

وە جاری واهەبووە "ق والقرآن المجيد"ی دەخوێند، وە ڕکاتی دووەم لە پاش سورەتی فاتیحە "اقترب الساعة وانشق القمر"ی دەخوێند. [١]

٣٥- ئەگەر نوێژخوێن چەند تەکبیرەیەك فریای نەکەوت، ئەوا پێویست بە قەزا کردنەوەی ناکات و وەکو ئیمام دەکات ئەوەنەی فریاکەوت ئەوەندە دەخوێنێت، ئەگەر ڕکاتێکی لە دەست چوو ئەو ڕکاتە قەزا دەکاتەوە بەشێوەی نوێژی جەژن.

٣٦- نوێژی جەژن بانگ و قامەتی نیە.

---

[١] رواه مسلم (٨٩١).

٣٧- ئیمام سەرەتا دەست دەكات بە نوێژ پاشان وتار دەخوێنێت.

٣٨- سوننەتە دانیشت بۆ وتار و گوێگرتن وە بێدەنگ بوون. چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژەكەی كرد پاشان فەرمووی: "مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَنْصَرِفَ فَلْيَنْصَرِفْ، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُقِيمَ لِلْخُطْبَةِ فَلْيُقِمْ" [١]

واتە: «هەر كەس پێی خۆشە بڕوات با بڕوات هەركەسیش پێی خۆشە دانشێت بۆ گوێگرتن لە وتار با دابنیشێت».

[١] رواه النسائي (١٥٧١)، وصححه الألباني.

٣٩- ئەوەی نوێژی جەژنی لە دەست بچێت دروستە قەزای بکاتەوە، بەشێوەی نوێژی جەژن.

٤٠- هەرکەسێك هات و فریای نوێژەکە نەکەوت وە ئیمام وتاری دەخوێند با دابنیشێت گوێ لە وتارەکە بگرێت پاشان نوێژی جەژن قەزا بکاتەوە، تاوەکو هەردوو خێرەکەی لە دەست نەچێت.

٤١- نوێژی سوننەت نییە لە پێش و پاشی نوێژی جەژن.

٤٢- ئەگەر ڕۆژی جەژن کەوتە ڕۆژی جومعەوە ئایا ئەو کەسەی کە ئامادەی نوێژی جەژن دەبێ دروستە ئامادەی نوێژی جومعە نەبێت و نەچێت بۆ نوێژی جومعە؟

**زانایان دوو بۆچونیان هەیە:**

**بۆچوونی یەکەم :** جومعەی لەسەر ناکەوێ و دەبێت ئامادە بێت و ئەمەش مەزهەبی زۆرینەیە لە : حەنەفیەکان و مالیکیەکان و شافعیەکان و وتەی زۆربەی زانایانە و وتەی پەسەندکراوی ابن المونزیر و ابن حەزم و ابن عبدالبرە.

چونکە خوای گەورە دەفەرموێ : (إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَاةِ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَة فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّه) لەم ئایەتەدا خوای گەورە نوێژی جەژنی جیا نەکردۆتەوە و بە گشتی باسی جومعەی کردوە کە واجبە ئامادە ببیت .

وە لەسەردەمی ئیمامی عوسماندا ڕەزای خوای لێ بێ ڕۆژی جەژن کەوتە جومعەوە لە وتاری جەژن بە خەڵکەکەی فەرموو : ئەی خەڵکینە ئەمڕۆ دوو جەژنتان بۆ کۆبوەتەوە هەرکەس پێی خۆشە چاوەڕێی نوێژی جومعەش بکات لە خەڵکی لادێ و شوێنە دوورەکان (أهلِ العوالي) ئەوا با چاوەڕێ بکات ، وە هەرکەسیش پێی خۆشە با بگەڕێتەوە ئەوا ئیزنم داوە بگەڕێتەوە . رواه البخاري (٥٥٧١)

کەواتە : ئەمە تایبەتە بە خەڵکی لادێ و شوێنە دوورەکان ، چونکە ئەوان لەدەرەوەی شاری مەدینەوە دەهاتن بۆ نوێژی جەژن و ڕێگاکەیان دوور بوو

قورس بوو لەسەریان جارێکی تر بگەڕێنەوە بۆ نوێژی جومعە .

وەهەروەها نوێژی جومعە فەرزە بە دەقی قورئان و سوننەت و یەکدەنگی زانایان ، بەڵام نوێژی جەژن هەندێک لەزانایان دەفەرمون سوننەتی موئەکەدەیە ، هەندێکیان دەفەرمون فەرزی کیفایەیە ، بەشێکی کەمیان دەفەرمون فەرزە ، کەواتە نوێژی جومعە لە نوێژی جەژن گرنگترە و نوێژی جەژن جێگای نوێژی جومعە ناگرێتەوە .

**بۆچوونی دووەم:** ڕوخسەت دراوە هەر کەسێک ئامادەی نوێژی جەژن ببێ دروستە ئامادەی نوێژی جومعە نەبێت، بەڵام واجبە لەسەر ئیمام جومعە بکات و ئەمەش مەزهەبی حەنبەلیەکان و وتەی کۆمەڵێکە لە سەلەف و وتەی پەسەندکراوی ابن تیمیە و ابن باز وابن عوسەیمینە.

**پوختەی باسەکە :**

باشتر و چاکتر وایە ئامادەی هەردوو نوێژەکە ببی ، ئەگەر وات کرد ئەوا هیچ کەسێک ڕەخنەت لێ ناگرێ کە کارێکی هەڵەت کردووە ، بەڵام کە تەنها ئامادەی نوێژی جەژن ببی و واز لە جومعە بێنێ ئەوا

خۆت دەخەیتە ناو خیلاف و ڕاجیاوازی زانایان و خۆتیش لە قەلەقی و دوودڵیدا دەبیت کە ئایا کارەکەم دروستە یان نا ، بۆیە ئامادەی هەردوو نوێژەکە ببە چونکە بەڵگەی بۆچونی یەکەم بەهێزترە کە دەفەرموێ : جومعەی لەسەر ناکەوێ و دەبێ ئامادە ببێ . والله أعلم

٤٣- ئەوەی کە نوێژی جەژن بکات بوترێت نوێژی جومعە و نیوەڕۆی لەسەر نامێنێت پێچەوانەی شەرعە و ڕاست نییە. [1]

---

[1] فتاوى اللجنة الدائمة (١٢٠/٧).

٤٤- ئەوەی نوێژی جەژن نەکات لە خەڵکی لادێ و شوێنە دوورەکان نوێژی جومعەی لەسەر لاناچێت دەبێت بڕوات بۆ نوێژی جومعە. [1]

٤٥- نوێژی جومعە لەسەر ئیمام لاناچێت، بەڵکو دەبێت بڕوات نوێژی جومعەکە بکات بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی نوێژی جەژنیان نەکردووە جومعەکەیان لە دەست نەچێت یان بۆ ئەو کەسانەی دەیانەوێت نوێژی جومعە بکەن. [2]

[1] فتاوی اللجنة الدائمة (١١٩/٧).

[2] فتاوی اللجنة الدائمة (١١٩/٧).

٤٦- لە ئادابەکانی جەژن: گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی یە، بە سەردانی کردنیان و تەلەفۆن بۆ کردن و هەدیە و ...هتد.

٤٧- جەژن کاتێکە بۆ عیبادەت کردن و خۆ نزیککردنەوە لە خوای گەورە و شوکرکردنی خوای گەورە لەسەر نیعمەتەکانی، کاتی گوناهـ کردن و سەرپێچی خوای گەورە نییە.

٤٨- نابێت شەوی جەژن تایبەت بکرێت بە شەونوێژەوە مەگەر کەسێك خۆی هەموو شەوێک شەو نوێژ بکات و عادەتی وابێ بە بەردەوامی.

٤٩- لە سەرپێچی یەکانی جەژن تێکەڵ بوونی ژن و پیاوانە لە شوێنی نوێژ یان جگە لەوێش.

٥٠- پێویستە لە جەژن ئاگامان لە خۆمان بێت و چاومان دابخەین لە ئاست حەرام، وە خۆمان بپارێزین لە بیستنی حەرام.

هەندێك لە هاوەڵانی سوفیانی ثەوری (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموون: لەگەڵی دەرچووین لە ڕۆژی جەژن، فەرمووی: ئەمڕۆ یەکەم شت بیکەین و ئاگامان لێی بێت چاو داخستنە بەرامبەر حەرام.

٥١- جەژن دەربڕینی خۆشی و ڕوو خۆشی یە بەرامبەر ماڵ و مناڵ، پێچەوانەی شەرعی تیا نەبێت.

٥٢- ڕێگەدان بە منداڵان بە گاڵتە و کڕینی یاری بۆیان بەشێوەیەکی شەرعی، بەڵکو ئەوە عیبادەت و نزیکبوونەوەیە لە خوای گەورە چونکە دڵخۆشی کردنی منداڵانە، وەکو لە فەرموودەدا هاتووە: **"لَتَعْلَمُ يَهُودُ أَنَّ فِي دِينِنَا فُسْحَةً، إِنِّي أُرْسِلْتُ بِحَنِيفِيَّةٍ سَمْحَةٍ".**[١] واتە: «تا جولەکە بزانن لە دینەکەی ئێمە فراوانی هەیە، من نێردراوم بە دینێك دوور لە شیرك وە نێردراوم بە لێبووردەیی.

[١] رواه الإمام أحمد (٢٤٨٥٥)، وحسنه الألباني في الصحيحة (٤/٤٤٣).

٥٣- جەژن کاتێکە جێگای خۆشی یە، بۆیە خۆشی دەرببڕدرێت، بە هەندێك گاڵتە و یاری کە شەرع ڕێی پێ دابێت.

عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرمووێت: "أَنَّ أَبَا بَكْرٍ، دَخَلَ عَلَيْهَا وَعِنْدَهَا جَارِيَتَانِ فِي أَيَّامِ مِنًى، تُغَنِّيَانِ وَتَضْرِبَانِ، وَرَسُولُ اللهِ ﷺ مُسَجًّى بِثَوْبِهِ، فَانْتَهَرَهُمَا أَبُو بَكْرٍ، فَكَشَفَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْهُ، وَقَالَ: "دَعْهُمَا يَا أَبَا بَكْرٍ فَإِنَّهَا أَيَّامُ عِيدٍ" [١] واتە: دوو کیژۆڵەی بچوک دەفیان لێ دەدا و گۆرانییان دەوت لە ڕۆژانی مینا، ئەبوبەکر لەو کاتەدا هاتە ژوورەوە،

---

[١] رواه البخاري (٣٥٢٩)، ومسلم (٨٩٢).

ئەوانیش خۆیان لێی دورخستەوە ویستی ڕێگرییان لێ بکات، پێغەمبەری خوا ﷺ لەوێ بوو، فەرمووی: «وازیان لێبێنە، ڕۆژانی جەژنە».

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دروستە کیژۆڵەی بچوک دەف لێ بدەن و گۆرانی بڵێن لە شیعر و وتەی باش لە نێوان خۆیاندا، بەڵام مۆسیقا حەرامە و بەهیچ شێوەیەك ڕێگە پێدراو نییە.

٥٤- دروستە لە ڕۆژانی جەژنی قوربان ئافرەتان دەف لێبدەن، بەڵام دوور بێت لە پیاوان و لەناو ئافرەتەکان خۆیان بێت بە بەڵگەی فەرموودەکەی پێشووی عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) .

٥٥- لە ڕۆژانی جەژن چەند یارییەکی ترسناك دەردەچێت و جێگای مەترسی یە، کە ئازاری خەڵك دەدات و ئەیان ترسێنیت، وەک یارییە ئاگرینەکان و تەرەقە و ... دەبێت منداڵ هەر لێی دوور بکەوێتەوە بەبێ هیچ دوودڵییەك، کە بەفیڕۆدانی پارەیە و مەترسی یە بۆ خۆی خەڵك و ترساندنی خەڵکە.

**نسأل الله تعالى أن يُجَمِّل أيّامنا بطاعته ويملأ بيوتَنا وقلوبَنا فرحاً وسروراً بِنعمته وأن يتقبَّل منا ومن المسلمين ، آمين**

وصلَّى الله على نبينا محمد وآله وصحبه وسلم .

**برا و خوشکی موسڵمان :**

(ماڵپەڕی بەهەشت ، ماڵپەڕی وەڵامەکان ، کەناڵی بەکورتی)

لە لایەن یەک ستافەوە بەڕێوە دەبرێت ، لە ژێر چاودێری کۆمەڵێک مامۆستای بەڕێز و شارەزای ئەهلی سوننە ، ئەوەی کە بزانین خێر و چاکە و ئێوەی بەڕێز شارەزا دەکات لە حوکمە شەرعییەکان ئێمە ئامادەی دەکەین و بە کورتی و پوختی دەیخەینە بەردەستی ئێوەی بەڕێز .

**تەنها داواکاری ئێمە لە ئێوەی بەڕێز ئەوەیە :** بابەتەکانمان بەکوردی بخوێننەوە و سودی لێ ببینن و بینێرن بۆ هاوڕێ و کەسانی تر بۆ ئەوەی خەڵکانێکی زیاتر سودمەند بن و ئێوەی بەڕێزیش بەشداربن لە خێرەکەی .

**تێبینی :** هەر بەڕێزێک پێی خۆشە هاوکارمان بێت و یارمەتیمان بدات لە بەرەو پێشچونی کارەکانمان دەتوانێت پەیوەندیمان پێوە بکات لە ڕێگەی ئەم لینکەوە

https://t.me/malpariba8